## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب : شەمەندەفەری ڕۆژگار

نووسینی : عمرعبدالکافی

وەرگێڕانی : عبدالجلیل علی

پێداچوونەوە : م/ مەلافەتحی زراری

کاری کۆمپیوتەر : زیلان

بەرگ : عەکاف احمد زراری

چاپ : یەکەم/هەولێر/٢٠٠٧

تیراژ : (١٠٠٠) دانە

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە
گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٧٧٩)
ساڵی ٢٠٠٧ پێ دراوە



بڵاوکراوەی کتێبخانەی

**حاجی قادری کۆیی**

بۆ فرۆشتن و چاپکردن و
بڵاوکردنەوە

هەولێر بازاری ڕۆشنبیری
تەنیشت تاپۆ

-٢٢٢٣٨٦٨ -

زنجیرەی تویێشوی بانگ خوازان (٨)

# شەمەندەفەری رۆژگار

د/ عمر عبد الكافی

و/عبدالجلیل علی

چاپی یەکەم

١٤٢٨- کۆچی

٢٠٠٧- زایینی

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

سوپاس وستایش بۆ ئەو خوایەی کە قورئانی بۆ سەر بەندەکەی خۆی دابەزاندوە وهیچ ناڕێکیەکی تێ نەکردووە، پاکی وبێ گەردی هەر بۆ ئەوە، کە سوورە لەسەر فەڕز کردنی پەیامەکەی .

﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ال عمران/١٠٤.

**واتە: پێویستە لە ئێوە ئومەتێك پێك بێت یان با هەمووتان ئومەتێك بن کە بانگخوازی بکەن بۆ چاکە وفەرمان بکەن بە هەموو کارێکی باو ودروست وقەدەغەی هەموو نادروستیەکان بکەن، ئا ئەوانە سەر فرازن. ((ت. ئاسان)).**

شایەدی دەدەم کە ﷲ تاکە وهیچ هاوەڵی نیە وشایەدی داناوە وتەواوی کردووە وڕاستە ڕێی داناوە:

﴿وَيَأْبَى اللّهُ إِلاَّ أَن يُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾ التوبة/٣٢.

واتە: خوا ناهێڵێت ئاواتیان بێتە دی هیچی تری ناوێت جگە لەوە نەبێت ئایین ونوری خۆی سەر بخات وتەواوی بکات ودیاری بخات هەر چەندە کافر وگاورەکان پێی سەغلەت ودڵتەنگ دەبن. ((ت. ئاسان)).

وشایەدی دەدم کە سەروەر وخۆشەویستمان محەمەد ﷺ نێردراوی خوایە: پەیامەکەی گەیاندوە وڕاسپاردەکەی گەیاندوتە جێ وئامۆژگاری خەلکی کردووە وتەم ومژی لاداوە وهەتا ڕۆژی کۆچی دوایی تێ کۆشایە بۆخوا بەڕاستی، خوایە گیان تۆ درود وسەلاواتی لەسەری بدە ولەگەڵ کەس وکاری ویاوەران وهاوسەرەکانی وشوێنکەوتەکانی کە بڕوایان پێ هێناوە، بڕوایان بەستەم نەپۆشیوە وبەڕاستی ئەوان دڵنەوایی وڕێگای هیدایەتیان هەبوو.

**ئیدی:**

برایـانی موسـڵمان شـەمەندەفەری كـات بـەخێرای تـێ دەپەڕێ، باكی بەهیچ نیە وچاوەڕێی كـەس ناكـات، جا هـەر كەسێك خۆی لۆ جولەی ڕۆژگـار وئـەو شـەمەندەفەرە ئامـادە بكات، ئـەوە بەڕاسـتی سـەركەوتووە، وهەركەسـێكیش نەگاتـە خێـرای ئـەم شـەمەندەفەرە، ئـەوە چاوەڕێ ناكـات مۆڵـەتی نادات.

هەروەها ئەو ساتە وەختەی كە دەگات كە پێویستە بەندە تێـدا لـەم دونیایـە كـۆچ بكـات وبـەجێی بێڵـێ، جـا ئـەو كاتـە دەزانێ ساتە وەختێك لـەم دنیایـەدا ژیـاوە ومایتـەوە چونكە دونیـا بـازاڕە، دادەنـرێ وهەڵدەگیرێتـەوە، هەركـەس قـازانجی تێدا بكات ئەوە بردیەوە وهەركەسیش دۆڕاندی ئەوە دۆڕا.

بـەڵام لـە بەخـشندەی خـوای گـەورە بـۆ ئـەم نەتـەوەی ئیـسلامە ئەوەیـە كـەوا كۆمـەڵێك وێـستگەی كاتـەكانی بـۆ بەندەكان دانایە بۆ ئەوەی بەخۆی دا بچێـەوە، لەبەر ئـەوەی بەڕاسـتی موسـڵمان لـەم دونیایـەدا بـۆ ئەوەنیـە كـەوا خـوای

پەروەردگاری لەبیر بچێتەوە، بەداخەوە لە باپیرە گەورەمان ئادەم ئەم دوو سیفەتەمان بۆ ماوەتەوە: لە بیر چوونەوە وبێ ووره‌یی:

﴿ وَلَقَدْ عَهِدْنَا إِلَى آدَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُ عَزْمًا ﴾ طه/١١٥.

**واتە: سوێند بەخوا بێ گومان، ئێمە پێشتر پەیمانمان لە ئادەم وەرگرت ((کە نزیکی درەختی قەدەغە کراو نەکەوێ)) کەچی لەبیری چوو ووەرەشمان لێی نەبینی وبەمەرجێ نەمان بینی بریاری لەسەر ئەنجامدانی ئەو سەرپێچییە بدات. ((ت.ئاسان)).**

بەڵێ بابەتی لەبیر چوونەوە لە ئادەم لەمەبەستی دا هەبوو، وەلێ نەتەوەی محەمەد ﷺ قەرەبووی بۆ کرایەوە، لەبەر ئەوە یەکێك هەر دەبێ لەم میللەتە کە هەر یادی خوا دەکات هەر لە نێوان چرپەك وچرکەیەکدا... نوێژی بەیانی تا نوێژی نیوەڕۆ و... هەورەها نوێژەکانی دیکەش لە هەینی تا هەینی، دیسان لە ڕەمەزان تا ڕەمەزانی پاشتری.

کاری موسڵمانە جێگەی سەرسوڕمانە، هەیە وا دەزانێ تەنها ڕەمەزان مامۆستای فێر کردنە، بۆ خواپەرستی خوای گەورە، بەڵێ ڕەمەزان زۆر خاسیەتی هەیە: لەوانەش خوای گەورە ئەو پەرستشەی ڕۆژووی بۆ خۆی تەرخان کردووە:

((كل عمل ابن ادم له الا الصوم فأنه لي وانا أجزي به)).

واتە: **خوا دەفەرمووێ هەموو کردەوەیەکی ئادەمیزاد بۆ خۆیەتی تەنها ڕۆژوو نەبێ، بەڕاستی ڕۆژوو بۆ منە وخۆم پاداشتی لەسەری دەدەمەوە.**

موسڵمانیش دەپرسێ: ئەرێ بۆچی بەتایبەتی هەر ڕۆژوو بۆ خوای گەورەیە؟ ئەی نوێژ بۆ خوانیە؟ ئەرێ زەکات بۆ خوانیە؟ ئەدی حەج بۆ خوانیە؟ ئەدی هەموو دروشمەکان بۆخوای گەورە نینە؟!

پرسیاری دووەمیش: ئایا فەرمانەکان لە ئیسلامەتی دا دەر ئەنجامی خۆشەویستی بەندەکان نیە بۆخوا، هەروەها خۆشەویستی خوایە بۆ بەندەکان، لە ژێر دروشمی ﴿يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَه﴾المائدة/٥٤.

واتـه: **خوا بەندەكانی خـۆش دەوێ وبەنـدەكانیش خوایـان خۆش دەوێ.**

یانیش ئەگەر مرۆڤ هەستی پێ كـرد خـوای خـۆش دەوێ ئـــەو كاتـــه پەرســـتنەكه لەســـەری ســـوك وئاســـان دەبـــێ، وئەگەریش خوای خۆش نەوێ كارەكەی لەسەر قورس دەبێ؟

پرسـیاری سـێیەم: ئـەرك و واجبـەكان لەسـەر موسـڵمان چین هەر لە ڕەمەزان وغەیری ڕەمەزاندا؟

برایانی موسڵمان: جێگەی سەر سووڕمانە كـه سـتەم كـار لـه ڕۆژی دوایـدا لـه چاكەكانی وەردەگـیرێ، ئەگـەر نەشـیما ئەوە لەخراپەی ستەملێكراوان دەخرێتـه سـەر سـتەمكارەكە، ئەوجا فرێ دەدرێتە ناو ئاگر "پەنا بەخوا".

واتـــه تـــۆ قورئـــان هـــەموو ڕۆژێ یـــان دوو ڕۆژ جـــارەك دەخوێنی، یان حەفتەیەك یا دوو حەفتـه جارێك دەخـوێنی، یان مانگ جارێك یان هەر لـه نـوی یـانیش ڕەنگـه تـەنها لـه ڕەمـەزان بیخـوێنی وبـەس. گرنگـه ئـەوە قورئـان خوێنـدن وخواپەرسـتیەكان خـوای گـەورە هـەموو دەیخاتـه تـەرازوی

چاكەكانت كە ڕۆژەی قیامەت هات وستەمت لە سەر هەبوو وەكو ((غەیبەت ودووزمانی وشت لە خەلك ستاندن وباسی ناموسی خەلك كردن وناوزڕاندن ستەم لیٚ كردن وڕاسپاردە بە فیڕۆدان وئەمانەت چواندن كە تۆ كرد بێتت...

كابرای ستەم لیٚ كراو كەتۆ لێت كرد بیٚ دێت ولە قورئان خوێندنەكەت وەردەگیریٚ هەروەها لە نوێژەكانیش وەردەگیریٚ و... دەدرێتە ئەو، زانایان دەڵێن خوێندنەوەی هەر پیتێك ((حەرفێك)) لە قورئاندا بەدە چاكە دەنوسرێت، بەلاٚم لەناو نوێژدا هەر پیتی بەسەد چاكە دەنوسرێت.

ئەمەش لە بەخشندەی خوای بەخشندەیە كە بۆت بە توێشو لە تەرازووت دادەنرێت.

جا كە قیامەت دەستی پیٚ كرد وهێشتا ستەم وزۆرداری لەسەرت مابوو ئەو كاتە چاكەی نوێژەكانت هەڵدەگیری هەورەها لە پاداشتی زەكات وحەجەكەشت... هەروەها لەهەموو عیبادەت وخێرەكانت تەنها یەك عیبادەت نەبیٚ ئەویش ((ڕۆژووە)) لەبەر ئەوەی خوای گەورە بۆ خۆی

تـەرخانی کـردووە وبـۆ خۆیـەتی کـە دەفـەرمووێت: تـەنها ڕۆژوو بۆ خۆمە!.

جا ئەگەر لەگەڵ بەندەیەك خراپە وستەمت هەبوو ئەوە هـەرگیز نـاتوانرێ وناشـێ لـە پاداشـتی ڕۆژووەکانـت کـەم بکاتەود وببات لەبەر ئەوە خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی:

((من صام رمضان ایماناً واحتساباً غُفر لـه مـا تقـدم مـن ذنبه))

واتـە: هەرکەسـێك ڕەمـەزان بـەڕۆژوو بـێ بـە بـڕواوە بـۆ ڕەزامەنـدی خـوا ئـەوە خـوای گـەوەر لەهـەموو تاوانـەکانی پێشتری خۆش دەبێت.

جا ئەگەر بەڕاستی لە ڕەمەزان بەڕۆژوو ببی وپاداشـتەکە وەربگـری ئـەوە هیـچت لـێ کـەم ناکرێتـەوە "ئـەوەش لـە بەخشندەی خوای بەخشندەیە".

((اذا صام العبد ابتعد عن النار... ((وفي روايـة)) سبعين خريفاً. ((وفي رواية)) كما يبتعد طائر غراب فرح، خرج من بيضته وظل يطير الى ان مات هرم)).

واتە: ئەگەر بەندەیەك ڕۆژێك بەڕۆژوو بێ لە ئاگر حەفتا ساڵ دوور دەكرێتەوە، لەریوایەتێكدا دەڵێ حەفتا ساڵ، ولەریوایەتێكدا دەفەرمووێ لە ئاگر دوور دەكرێتەوە هەر وەكـو قەلـە ڕەش كـە هێلكەكەی دەتروكێنێ واز لە جوجكەكانی دەهێنی وبەجێ یـان دیلێ بە فڕین دەدات هەتا لە زۆر پیری دەمرێ لە دووری.

بـۆ زانـین قەلـە ڕەش تەمـەنی درێـژە تـا (٦٠٠)سـاڵ دەژی ئـەوەش بەلگـەی دووركەوتنـەوەی ڕۆژووگـرە لـە ئـاگر، بـە ئیزنی خوای گەورە، بـە قـەد ئەوقەڵە ڕەشـە دوور دەكـەوێ، هەروەها لـەوەش سـەر سوڕهێنەرتـر خـوای گـەورە بەڕاسـتی سیفەتێكی بە موسڵمان دایە ئەویش تۆلـەكاتی نوێـژدا وەكـو فریشتیەت لێ دێ: نە دەخۆی ونەدەخۆیەوە ونـە سەرپێـچی لەو كاتـەدا دەكـەی ونەدەخـەوی وفـەرمانی خـوا جێ بـەجێ دەكـەی ئـەوەش خاسـیەتی فریـشتەكانە كـە (( چـوار نیـاز وكردەومیە)).

هەندێك زانا سیفەتی فریشتەیان شیكردیتەوە:

﴿أُولِي أَجْنِحَةٍ مَّثْنَى وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ﴾ فاطر/١.

**واتـە: فریشتەکان کە خاوەنی چەندان باڵن، هەیانە دوو باڵە وسێ باڵە وچوار باڵن.**

نوێژی بەیانی ودووڕکاتی سونەتەکە یان شەو نوێژ یان سوننەت یان هەر خەلاَتێك وەکو ئەوەیە کەوا نوێژکار ببوێتە فریشتەی باڵدار بووە بە فریشتە، دووباڵی هەیە ئەگەر نوێژی ئێوارەشت کرد وەکو ئەو دەبیتە ئەو نازدارەی کە سێ باڵی هەیە وجا ئەگەر نوێژ چوار چوارت کرد، وەکو ئەم فریشتەی بەسەر دێ کە چوار باڵی هەیە واتە ((فریشتەی چوار باڵ)).

ئەمەش لەبارەی نوێژ، وەلێ خوای بەخشندە لە بەخشندەی خۆی دەیەوێ بۆ ئوممەتی خۆشەویستی ﷺ دەیەوێ مانگێکی تەواو بتکات بە فریشتەی باڵدار هەر لەزەردەی بەرەبەیانەوە هەتا دەگاتە خۆرئاوا بوون نە دەخۆی ونەدەخۆیەوە ونەسەرپێچی دەکەی وهەر ئەوەندە دەکەی کە فەرمانت پێکراوە.

کەوایە تۆ لەو کاتەی فریشتەی لە پەروەردگارت نزیک دەبییەوە، جا سوپاس گوزاری خوا بکە لەسەر بەخشینی ئیسلام ولەسەر فەزلی خوا بۆت، سەرەڕای ئەوەی تاوانەکانمان بۆ بەرز دەبێتەوە ئەویش چاکەکانی بۆمان دادەبەزێنێ لە فەرمایشتێکی قودسیدا هاتیە خوای بالآ دەفەرمووێت:

((اني والجن في نباء عظيم اخلق ليعبد غيري وارزق ويشكر غيري خيري الى العباد نازل، وشرُ العباد اليَّ صاعد وهم يبتغضون اليَّ بالمعاصي أهل ذكرى اهل شكري اهل طاعتي اهل محبتي اهل معصيتي لا اقنطهم من رحمتي من تاب منهم فأنا حبيبهم ومن لم يتب فأطبيبهم من جاءني منهم تائباً بلقيته من بعيد ومن ذهب منهم عاصياً ناديته من قريب الى أين تذهب؟ او وجدت رباً غيري أم وجدت رحيماً سوى؟)).

واتە: خوای گەورە دەفەرمووێ: من ومرۆڤ وپەری لە هەواڵێکی گەورە داین، دەیخولقێنم وغەیری من دەپەرستێ

وبژێوی دەدەم سوپاسگوزاری غەیری من دەکات، چاکەکانم بۆ بەندەکان دادەبەزێ وخراپەکانی بەندەکان بۆمن سەر دەکەوێ، خۆشم دەوێن بەڵێ خۆش بوون، ئەوانیش بە تووڕە بوون لێم سەرپێچی دەکەن یادکاران سوپاسگوزاری منن، گوێرایەڵانم خۆشەویستانی منن، سەرپێچیکارانم بێ ئومێد ناکەم لە بەزەیی خۆم، هەرکەس لەوان تۆبە بکات خۆشەویستی منە، هەر کەسیش تۆبە نەکات هەر خۆم نوشداریم، هەر کەس بە تۆبەوە بێت لە دوورەوە دیداری دەکەم، وهەرکەس لەوان بە سەرپێچییەوە بڕوات لە نزیکەو بانگی دەکەم: بەرەو کوێ دەڕۆی؟ پەروەردگارێکی غەیری منت دۆزیتەوە یان میهرەبانێکی بێجگە لەمن؟.

ئایا لەم بونەوەرەدا لە پەروەردگاری بەندەکان کەس میهرەبانتر هەیە؟ ئەوەش لە ڕەحمەتی خۆیەتی "کە بالآیە" بەلێ ئەم هەموو وێستگە بەندایەتیە وئەم هەموو دروشمە بەرزە زۆرەی بۆمان فەراهەم کردیە کە مرۆڤ پێی بەرز دەکاتەوە تەنها ڕۆژو نەبێ بەڕاستی ڕۆژووی بۆ خودی

خوایە هەر خۆی پاداشتی دەداتەوە. "خوایە گیان لە ڕۆژووە وانمان بگێری".

تەوەرەی دووەم: ئەم بەشە بریتیە لە: ئایا فەرمانەکان لەسەر خۆشەویستی دامەزراون یان خۆشەویستی وا لە بەندە دەکات کەوا فەرمانەکان بە دڵێکی گوشادەوە وەربگرێ، ورکیش وای لە بەندە دەکات کەوا فەرمان قەبوڵ نەکات؟

نموونە کوڕەکەت تۆی خۆش دەوێ، تۆش ئەوت خۆش دەوێ، هەر فەرمانێکی پێ بکەی ئەوە بەخەیاڵێکی ئاسودە جێ بەجێی دەکات، بەلام ئەگەر کوڕێکی لاسار وگوێڕایەڵ نەبوو گومانی چی لێ دەکەی بیکات؟ چۆن لێی ڕادەبینی؟

وەڵامەکەی: کوڕە لاسارەکە وا هەست دەکات کە فەرمانەکەت هیچ وپوچە، لە دڵی ناخۆشە ولە بەر دڵی گرانە، کەواتە ناتوانی جێ بەجێی بکات، هەروەها سەرپێچی کارانیش هەر بەو شێوەن پێی دەڵێی: کاکە ئەوە حەرامە، نەزەر حەرامە، غەیبەت حەرامە، ئەگەر بە درێژای شەوگار شەو نخونی بکەی بۆ گوێدانە گۆرانی وکلیپ حەرامە

ودروست نیە... وەلێ گوێت بۆ نـاگری وگوێرایـەلی لەسـەری قـورس دەبـێ، چـونکە حـەق تالـە ونـالۆزە لەسـەری، بـەلام ئەگەر تۆبەی کرد هەمووی دەگوڕێ.

کەسێك دەیگوت: بیـست سـالی تەمـەنم هـەر هـەولم دەدا لەســەر نوێــژو عیبــادەت خــۆم ڕابێــنم نــەمتوانی "واتــە عیبادەت لەسـەر دلی گـران بـوو" پاشـان بیـست سـالی دیکـە ویستم واز لە نوێژ بهێنم نەمتوانی! واتە کاتێك پابەند بـوو بـە ((خۆشەویـستی)) هـەر کـە کەوتـە نـاو نوێـژ ولەسـەری دامەزرا ولەدل ودەرونی جێگیر بوو دلی نایێ واز لێ بهێنی.

لەبەر ئەوە سەرنج بدەنە ووشە شیرینەکەی خۆشەویست ﷺ لەبەسەر هاتی ((تائیف)) دەیفەرموو: خەلکی تائیف بە شێوەیەکی نائاسای کـە ڕێـزی مێوان بگرن، منـدال وخـەلکی نەفامیان هاندا وخۆشەویستمان ﷺ زۆر بەبێ شەرمی بەرد باران کرد وهـەتا خـوێن لـە قاچـەکانی پـیرۆزی دەچۆڕایەوە سەر زەوی، جـا لـەو کاتـەی چـووە ژێـر سـێبەری باخێـك بـە

ناوی ((بن ئـەبی ربیعـە)) ڕوو ودەسـتی بـەرەو ئاسمـان بـەرز کردووە وفەرمووی:

((اللهم اني أشكو اليك ضعف قوتي وقيلـة حلتي وهواني على الناس، الى من تكلني الى بعيد يتجهمني ام الى عدوٍ ملكته أمري، ان لم يكن بك غضب عليَّ فلن أبالي)).

**واتە: خوایە لاوازی هێز وبێ توانایم بەدەست خەلکەوە بۆ لای تۆ دەهێنم، ئەی میهرەبانترینی هەموو میهرەبانان تۆ پەروەردگاری ژێر دەستەکانی، تۆ خاوەنی مـنی بـەکێم دەسـپێری، بـە دوورە کەسێك ئازارم بدات، یان دوژمنێك کارت داوەتە دەستی، ئەگەر تۆ تووڕە نەبی من باکم نیە.**

بەلأم بێ وەی کردنی تۆ بۆمن گوشاد ترە، پەنا دەگرم بە نـوری ڕووخـساری تـۆ، کەهـەموو تاریکـستانیکان ڕوونـاك کردۆتەوە، وکاروبار ودونیا ودوایی لەسەر دامـەزراوە، لـەوەی تـووری خـۆتم بەسـەردا دابـارێنی، یـان خـەشمت بمگـرێ وڕاز ونیاز هەر بۆ لای تۆیە هەتا ڕازی دەبیت ولا حول ولا قوە الا بالله.

بەڵێ ئەمەیە خۆشەویستی ڕاستەقینە وزۆر جاریش ئەم نزایەی دەفەرموو:

((اللهم أني اسألك حبك وحب من أحبك وحب عمل يقربني الى حبُكَ )).

واتە: خوایە گیان داوای خۆشەویستیت دەکەم وخۆشەویستی کەسێك کە تۆی خۆش ویست بێ وخۆشەویستی هەرکارێك کە لەخۆشەویستی تۆم نزیك کاتەوە.

بەڵێ ئەمەیە خۆشەویستی ڕاستەقینە ئەگەر لە دڵی بەندەدا جێگیر بوو، جا گوێڕایەڵی لەسەر دڵی ئاسان دەبێ، بەبەڵگەی:

یەکەم: ڕۆژی ڕەمەزان تۆ لەدوای مامۆستایەك ڕادەوەستی وهەشت سەعات نوێژ دەکەی، یان بیست سەعات وزیاتر وڕەنگە کەمتر لەوانەیە سەخت بێ لە ڕۆژی دووەم ئارام دەگری کەمێك بارەکە سوکتر دەبێ ولە دە شەو

وڕۆژەكـانی كۆتـایی ڕەمـەزان شـەو نوێـژ دەكـەی ولەوانەیـە جزمێـك یـان دووجـزم قورئـانیش بخـوێنی ولەوانـە سـێ جزمیش... هەروەها لە مزگەوتیش دەمینێیەوە ودەبینی لـە عیبـادەت سوكتری وكـەمتریش دەخـەوی وتـام وچـێژیش لـە عیبادەت پتر دەكەی، لەبەر ئەوەی خۆشەویـستیەك نـاو دڵـی تەنیوی... هەروا هاوەڵانیش بەم جۆرە بوون، ساڵ هەموو لە لایان ڕەمەزان بووە، ئەگەر بەناو مەدینە دا ڕەت بـای گوێـت لـە نـوزەی ماڵـەكان دەبـوو "خـوا لێیـان ڕازی بـێ" هـەروەكو ویـزەی هـەنگ لـە قورئـان خوێنـدن وشـەو نوێـژدا بـوون... بەڵام لە ڕەمەزان جا ئەو هەستە ئیمانیە لای ئێمەش هێـشتا پتر دەبێ، چونكە لە خوای بالا نـزیكتر دەبنـەوە... برایـانی موسڵمان: بەڕاستی ئایینەكەمان مـەزن وپـیرۆزە چـونكە ئـەم ڕێو ڕەسمانە دنیا ودوای دەگرێتـەوە، تـۆ لەسایەی ئیـسلامدا كاری دنیای دەكەی، بەڵام ئەگەر نیەتت ونیازی دڵت بۆ خـوا بێ ئەوە پاداشـتی لەسـەر وەردەگری ولەلایـەن خـوا بەچاكە بۆت دەنوسرێ... جا ئەو كەسەی كە لە تاوەری فرۆكە خانـە

چـاودێری فڕۆکەخانەکـە دەکـات، چـاودێری هــەڵ فــڕین وهەڵنیـشتنەوەی فڕۆکـەکان کـۆنترۆڵ دەکـات.. پێـی دەڵـێن: ئەگەر کاتەکەت کەوتە کاتی نوێژی هەینی ئەوە هیچ نـەنگی نیە "بە ئومێدی خوا" چونکە تـۆ چاودێری پارێزگاری لـە ژیانی خەلکی دەکەی، جا ئەگەر بەنیازێکی پاك بۆ خوا ئـەو کارەت کرد ئەوە تۆ پاداشـت وخێـرت لای خـوا بـۆ دەنوسـرێ هەتا بەردەوام بی...

هەروەها ئەو نوشدارەی کە لـە نەخۆشـخانە دایـەو دەڵێ: مــن چــاوەڕێی نەخۆشــی شــڕو لــێ قــەوماوی گرفتــەکان وڕووداوەکـان دەکـەم یـان... ژنێـك کـە منـداڵی دەبـێ یـان مرۆڤێـك لـە تەنگـە تـاوی دڵـدا دەنـاڵێنێ، پزیـشکەکە لەبـەر خزمەتی ئەمانە ناتوانێ بەشداری تەراویح بکات، ئێمـە پێـی دەڵـێین: ئەگـەر مەبەسـتت لـەو کـارەدا کـە دەیکـەی پاداشـت وکرێی خوا بێ، چونکە هەر کەسێك مرۆڤێك لەمردن ڕزگـار بکـات وەك ئـەو کەسـەیە کـە هـەموو دنیـای ڕزگـار کردبـێ، هـەروەها ئەگـەر هـەر کەسـێك یـەکێك بکـوژێ وەکـو ئـەو

کەسـەیە کـە هـەموو مرۆڤایـەتی کوشـتبی... جـا کاتێـك تـۆ پێداویـستی خـەلکی جـێ بـەجێ دەکـەی و خزمـەت دەکـەی تەندروستیان ودەپارێزی ئەوکارەت ئەرکێکی پیرۆز وواجبـە بـەلاّم نوێـژی تـەراویح سـوننەتە، فـەرز پـێش سـوننەت دەکەوێ، بۆیە هاوەلاّن بەم شارەزاییە کاریـان دەکـرد تـا دنیـا ودواییـان ئـاوەدان کـردەوە وقاچـەکانیان لەسـەر زەوی بـوو، بەلاّم دلّەکانیان لە تاقی ئاسمان بوو، هەر بە عیبـادەتی وورد ڕانەدەوەستـان "هەرچەنـدە ئەوەش لای خوایە" بەپشتیوانی خـوا ئـەویش گەورەیـە، بـەلاّم ئـەوان وا لـە ئـایین حـالّی نـەببوون کـە تەسـك وتـەنگی بکەنـەوە هـەروەکو هەنـدێك وایتێ دەگەن...

جـا بەڕاسـتی ڕەمـەزان هـەلّێکی زێڕینـە کـە سـەرمان لـێ دەداتەوە بـۆ ئـەوەی بـەو گیـان وتێگەیـشتنەوە پێـشوازی لـێ بکەین بەشێوازێکی شیرین "بەپشتیوانی خوای گەورە".

برایان: بەڕاستی ڕەمەزانی جاران لای پێشینە بەڕێزەکان وەکو ئەم ڕەمەزانی ئێستا نەبوو، گرفتەکەش لەخۆمانە نەك لە ڕەمەزان چونکە خوای گەورە دەفەرموویێت:

﴿ إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِندَ اللّهِ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِي كِتَابِ اللّهِ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَات وَالأَرْضَ مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ﴾ التوبة/٣٦.

**واتە: بێ گومان ژمارەی مانگەکان لای خوا دوازدە مانگە، لەکتێبی خوادا لە ((لوح المحفوظ)) دیاری کراوە، هەر لەو ڕۆژەوە کە ئاسمانەکان وزەوی دروست کردووە، چوار مانگی بەحەڕام داناوە نابێ جەنگی تێدا بکرێ.((ت. ئاسان)).**

خۆ کات وزەمان وڕۆژگار نەگۆڕاوە وەلێ خەلکی خۆیان گۆڕاینە، خەلك جۆرێکن لە بونەوەر، جا فریشتەکان لەو بەرزترن وئاژەڵەکانیش لەو نزترن، واتە مرۆڤ لە بازنەی نێوان هەر دوو لادایە فریشتەکان بەرزترن چونکە سەرپێچی ناکەن وئاژەلیش لەو نزم ترن چونکە خوای گەورە ڕاینەسپاردینە بۆ پەستن، گوێڕایەلی خوایە هەرچۆن

بێت ((بەخۆشی بێ یان ترشی)) هەروەکو بەدیهێنانی زەوی وئاسمانەکان:

﴿ قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ﴾ فصلت/١١.

**واتە: ئاسمانەکان وزەوی خێرا گوتیان ملکەچی تۆین وچۆن دەفەرمووی وادەکەین. ((ت.ئاسان)).**

جا مرۆڤ بە عیبادەتی لەدەوری ئەم دروشمانە بەرز دەبێتەوە بەرەو پەیڕەوکاری وکردەی جوانکاری لە ژیانیدا **بۆ نموونە:** ئەگەر دیتت ژنەکەت لە ڕەمەزاندا زمان شیرین وقسە خۆش دەبێت، ولەناو دڵتدا خۆشەویست دەبێ، لای ڕەزا سووك دەبی وسوپاسی دەکەی ئەگەر شتێکت بۆ بکا... هەروەها خێزانەکەت دەڵێ: سوپاس بۆ ئەو خوایە کە ڕەمەزانی پێ بەخشین کە بووە مایەی خۆش بەختی وسرووشت چاکی مێردەکەم.

هەورەها ڕەمەزان هات و ژەنەکەت ڕووی خۆش دەکات لەبەرانبەرت وبەسۆز ومیهرەبان دەبێ لەگەڵ خۆت

وڕۆلەکانت، وای لێ هاتووە بەسەرت دا ناقیژێنی لەناو ماڵدا "لەبەر هەر هۆیەك" ئەوکاتە: دەڵێی سوپاس بۆ خوا کە ڕەمەزانی پێ بەخشیوین وژنەکەم تێیدا گۆڕاوە وبوویتە فریشتەیەکی پاك وقسەی لەگەڵم خۆش بووەو بەسەرمدا هاوار ناکات ونەرم ونیان وڕوو خۆش بوو لەگەڵمدا بەهۆی هاتنی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز.

هەروەها خاوەن کار وکارگەکانیش کە کرێکار لایان ئیش دەکەن ویان کارمەند دەست پاك دەبێ لەخوا دەترسێ، دەڵێ: بەخوا هیچ شتێك بۆ خۆم بە حەلاڵ نازانم تەنها ئەوە نەبێ کە مافی خۆمە ئیشی بۆ دەکەم. .

جا منیش خۆم لە پارەو سامانی ئەو کەسە دەپارێزم کە ئیش لەلای دەکەم، جا ئەو کاتە خاوەن کارەکە پڕ بەدڵ سوپاسی پەروەردگاری دەکات ودەڵێ: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ڕەمەزانی پێ بەخشین ونێمەشی کردە موسڵمان کە بە ڕۆژوو دەبین، بەو شێوەیە کارمەندەکە بەرەو ئەو پاکیە دەگۆڕێ...هەروەها کارمەندەکە کە خاوەن کارەکە دەبینێ

دڵـی پـێ دەسـوتێ ورێـزی دەگـرێ لای خۆشەویـست بـووەو تەوقـەی لەگـەڵ دەکـا ولـەڕووی پێدەکـەنێ ودڵـی بـە حـاڵی دەسووتێ گلەی وگازاندەی گوێ لێ دەگرێت...

بەو شێوەیە پەرستشەکان وبەندایەتیەکان ئاوێتەی یەکتر دەبن لە ژیـانی موسـڵمانان دا، جـا موسـڵمان بـە چاوی خـۆی دەبـینێ کـە دروشمـەکانی خـوای گـەورە چـۆنن چـۆن ئـەم پەیامە خەلکی لـە چەقبەسـتنی دنیـا بـەروە بـەرفراوانی دوا ڕۆژ دەگۆڕێ.

ئەمەش (ڕەبیعی کوری عامرە) کاتێك چووە لای ڕۆستەم سـەرکردەی فارسـەکان کـە ڕۆسـتەم لێـی پرسـی: ئـەویش وەڵامەکەی زۆر سـەر سوڕهێنەر بـوو، ڕۆسـتەم بـەو هـەموو دەسەڵات وسامان وگاوری وبەندانەی ئاگری خۆی پێی گوت: ئـەی پـێ پـەتی چ شـتێك تـۆی هێنایـە ئێـرە؟ هـەر یەکـەو دەدینارتان دەدەمێ ولە کێندەر هاتینە بڕۆنەوە!!

ڕەبیـــع وەڵامـــی دایـــەوە: بێگومـــان خـــوا ئێمـــەی بـــە پێغەمبـــەرێك ﷺ شـــاد کـــردووە بـــۆ ئـــەوەی بەنـــدەکان

لەبەندایەتی بەندان ڕزگار بکەین بۆ بەندایەتی پەروەردگاری بەندەکان، وخەلکی لە ستەمی ئایینەکان دەرباز بکەین بەرەو دادپەروەری ئیسلامەتی، وخەلکی لەتەنگانەی دنیا بەرەو بەرفراوانی دوا ڕۆژ ڕزگار بکەین.

یان (تاریقی کوڕی زیاد) کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناردی بۆ ڕزگار کردنی ئەندەلوس، کە نێردەکەی چووە لای ڕۆستەم گوتیان: ڕێو ڕەسمی میواندار ی ئەو کەسەی کە بێتە بەر دەستی پاشاکەمان پێویستە بچەمێتەوە سەر شۆڕکا، کە لەلای سەرکردەی موسڵمانان هاتبێ، بەلام ئەو پیاوە موسڵمانەی کە تاریق ناردبووی نەیویست سەر شۆرکا گوتی: نا، نا بۆ هیچ کەس ناچەمێنەوە تەنها بۆ خوای ئاسمانەکان وزەوی نەبێت[1] سەر شۆڕ ناکەم.

---

[1] بەداخەوە لەم سەردەمەی ئێمەدا لە فەلسەفە وبێدەسەلاتی خۆمان ڕەنگە هەیە بلێین چ زیانی پێ دەگەیشت ئەگەر سەری شۆر بکات، چ گرنگی تێدایە خۆ چەماندنەوەیە نەك ركوع بردن؟... بەلام پیاوەکە سەری شۆر نەکرد! بەلام ئەم قارەمانە موسڵمانە لەو فەلسەفەیەی ئەم

جا دەست وپێوەندی پاشاکە گوتیان: تەگبیرێکی باشمان پێیە ئەویش ئەوەیە با دەرگایەکی نەوی لە کۆشکەکەت بکەینەوە بۆ ئەوەی کە ئەو پیاوە هاتە لات خۆی بچەمێنێتەوە بە ناچاری سەری شۆر بکات، پاشاکە گوتی: بەڕاستی تەگبیرێکی چاکە، جا کە بەیانی کابرای موسڵمانیان هێنا ئەو دەرگایەی دیت لە کۆشکەکە تێگەیشت، ئەوجا دانیشت وهەردوو قاچی بەرەو ڕووی پاشا درێژ کرد، ئەوجا لە دەرگا کە خۆی خشاند پاشان ڤیت هەستاوە، گوتی: ئەمن

---

سەردەمەمان نەیخوێند بوو، هەڵوێستی بەڕێزی ئەو ئافرەتە موسڵمانە ئەڵمانیەم بیردێتەوە کە دوو ساڵ پێش ئیستا پرسیارێکی سەیری لێکردم،گوتی: سێ کوڕم هەیە فارەمانی گەمەی (جۆردن) لەسەر ئاستی ئەڵمانای) ئەو ژنەش موسڵمان بوو دەیزانی رکوع تەنها بۆ خوا دەبێ... گوتی: ئایا ئەگەر کوڕەکانم لە گۆڕەپانی (جۆردن) لەسەرەتای ساریەکە بچەمێنەوەن ئایا ئەم خۆ چەماندنەوەیە بۆ غەیری خوا دادەنرێ، پاشان گوتی: ئەگەر ئەو چەمانەوەیە بۆ غەیری خوا بێت ئەوە قەدەغەیان دەکەم لە یاریەکەش، چونکە ئێمە بێجگە لەخوا سەر بۆ کەس شۆڕ ناکەین، چونکە ئایینە داوای سەربەرزیمان لێ دەکات.

بێجگە لەخوای پەروەردگاری جیهانیان بۆ کەس ناچەمێمەوە.[٢]

یان ئەم هاوەڵە بەڕێزە کاتێك سەرکردەی ئاگر پەرستە فارسەکان، خۆڵی لەسەر سەری دانا وهاوەڵەکانی زۆر توورە بوون وگوتیان: ئەوە یاوەری خۆشەویستە ﷺ ئەو کابرایە خۆڵ بەسەریدا دەکات؟

جا پیاوەکە پێ کەنی وگوتی: بە کردەوەی خۆی خاکی باب وباپیرانی دۆڕاند وبۆ ئێمەی بەجێهێشت، پاشاکە پێی گوت: لێت خۆش نابم ولە هاوەڵەکانت خۆش نابم هەتا سەرم ماچ نەکەی، جا ئەم هاوەڵە هەستاوسەری ماچ کرد.

جا کە هاتنەوە مەدینە عومەری کوری خەتتاب رضي الله عنه بەرانبەر هەموو خەلکی هەستا وسەری ئەو قارەمانەی ماچ

---

[٢] سەرنج بدە ئەم پەیامە بەرزە بکە کە لە دڵی بەندەیەك جێگیر بووە چی کرد (سەری شۆڕنەکرد) هەر لەبەر ئەوەیە ڕۆژ ئاوایییەکان لە موسڵمانان دەترسن وخۆیان لێ لادەدەن وبەنهێنی پیلانیان بۆ دادەنێن.

کرد وفەرمووی: دەبا هەموومان سەری ئەم یاوەرە بەڕێزە ماچ بکەین، چونکە بەو کارەی کە کردی موسڵمانانی لە دیلی ڕزگار کرد.

بەڵێ ئەوها خوا پەرستی ودروشمەکانی دڵی بەندەکان ئەوها ئیسلامەتی لە دڵی خەلکی دا دروست دەکەن بەڵام ئەدی عیبادەتەکان لەم ڕۆژگارە چ لەدڵی بەندەکان دروست دەکەن؟ وەڵامەکەی : ئەگەر مانگی ڕەمەزان لە ڕۆژوو گرتن گۆڕی بێ بۆ مانگی خواردن ونەوس خەلکی لەو کاتانەدا دەبینێ داروخان بۆ بەیانی وەکو ئەوەی گرانیەکی قورس بەسەر موسڵمانان هاتبێ، ئەگەر ئەو خەلکە لە ڕەمەزاندا لە بازاڕدا ببینی حالیانە چۆنە سەرت سوڕ دەمێنێ دەستە پاچە دادەمێنێ ودەڵێی: مانگی ڕەمەزان خەلکی چ دەخۆن؟

جا چ سودێك لە زۆر خواردن هەیە ومانگی ڕەمەزان ((ئەگەر ببێتە مانگی ورگ زل کردن)) ئەم قسەیەش هەموو ساڵێك لە ڕەمەزان دووبارە دەگوترێتەوە، بەلام زۆربەی موسڵمانان تەنها ئەو کەسە نەبێ کە خوا ڕەحمی پێ کرد

هەموو دوو گوێیان هەیە وگوێ دەگرن بەڵام دەچێتە گۆیەك ولەوی دیکە دەردەچێ ((تەقەی سەریان دێ)).

لەخوا دەپاڕێمەوە کە لەم ئایینە تێمان بگەیەنێ ولە نەزانی فێرمان بکات ولە نەفامی ڕزگارمان بکات

خرایەگیان پەیادارمان بکە.. ئامین

ئیتر سوپاس وستایش بۆ پەروەردگاری جیهانیان

والحمد لله رب العالمين
ربنا تقبل منّا أنك أنت السميع العليم